لە پەرتووکی Logo Design Love ـەوە

# 25 ئامۆژگاری بۆ دیزایین کردنی لۆگۆیەکی گونجاو

وەرگێڕانی سەردار عبدالله

لە بڵاوکراوەکانی ماڵپەڕی تۆڕی تەکنەلۆژیای زانیاری کوردی

http://www.kitn.net



تۆڕی تەکنەلۆژیای زانیاری کوردی

وردترین . نوێترین . خێراترین

# ٢٥ ئامۆژگاری بۆ دیزایین کردنی لۆگۆیەکی گونجاو

پەرتووکی LogoDesignlove کرداریانە پەرتوکێکی نایابە سەبارەت بە دیزاین کردنی لۆگۆ. ئەم پەرتووکە پێکهاتووە لە ١١ بەش و بەشی ١١ بریتییە لە پوختەی پەرتووکەکە و هەمووی لە ٢٥ ئامۆژگاری بێ وێنە سەبارەت بە دیزاینکردنی لۆگۆیەکی گونجاو کۆکراوەتەوە و بە دڵنیاییەوە هەر لۆگۆدیزاینەرێك پێوستە ئەم خاڵانە ڕەچاوبکات کە نوسەری پەرتوکی ناوبراو (دەیڤد ئەیرەی) لە کۆتایی پەرتوکەکەی بۆی کۆکردوینەتەوە بۆ ئەوەی گشت لایەك سودمەندبن و بەهۆیەوە جوانترین و نایابترین لۆگۆ دروستبکەین و کڕیارەکانمانی پێ سەرسام بکەین.

## ئامۆژگاری یەکەم: پرسیاری لێبکە، دوبارە و سێ بارە.

لە سەرەتای هەر پرۆژەیەکی دیزایندا، تۆ پێوستە لەسەرت کە چەندان پرسیار لە کڕیارەکەت بکەیت. تۆ پێویستە لەسەرت تێگەیشتنێکی گشتگیرت هەبێت لە خواست و ئارەزووەکانی کڕیارەکەت و هەروەها کێن کێبەرکێکارەکانی کڕیارەکەت و هەروەها لە کۆندا چی بۆ کڕیارەکەت کراوە سەبارەت بە لۆگۆکەی. دواین شت تۆ پێویستە بیزانیت لە کۆتایی هەر پرۆژەیەك ئەوەیە کە پێشتر کێبەرکێکاری کڕیارەکەت هەمان نیشانەی بەکارهێناوە یان ستایلەکەی هیچ پەیوەندیەکی بە ئامانجەکانی کڕیارەکەتەوە نەبێت.




## ئامۆژگاری دووەم: تێگەیشتن لە نرخی چاپ

هەر لەسەرەتادا پرسیار لە کڕیارەکەت بکە ئەگەر ئەو بودجەیەکی تایبەتی دانابێت بۆ بابەتی چاپ چونکە ڕەنگ هەمیشە تێچوونی زیاترە و لەوانەشە فراوانی دیزاینەکەت سنورداربکات. نرخی هەر

چاپەمەنییەك بێ هاوتایە. لەگەڵ هەندێك چاپەمەندیدا تۆ لەوانەیە بۆت دەربکەوێت کە نرخ و تێچوونی ڕەنگی تەواو لە یەك ئاستدانە لەگەڵ کاری یەك ڕەنگیدا, بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەمە دەگمەنە. ئەوە کاری تۆیە لەسەرەتای پرۆسەکە کڕیارەکەت ئاگاداربکەیتەوە سەبارەت بە پێداویستییەکانی چاپی بازرگانی و سنورەکانی.

### ئامۆژگاری سێیەم: پێشبینی پێشبینی نەکراو بکە!

ئەگەر تۆ دڵنیا نیت لەوەی کارەکەت چەند دەخایەنێت ئەوا هەمیشە زیاتر بخەمڵێنە. بۆ نمونە, ئەگەر تۆ وا هەست دەکەیت ئەو کارەی کە دەیکەیت هەفتەیەك دەخایەنێت بۆ کارکردن لەسەر ڕەخنە و پێشنیاری کڕیارەکەت و گەیاندنی کارە هونەریەکەت ئەوا بڵێ دوو هەفتە دەخایەنێت پاشان کڕیارەکەت دڵخۆش بکە بەپێدان و تەواوکردنی کارەکەت پێش کاتی چاوەڕوانکراو. پرۆژەی دیزاین وەکو پرۆژەی بیناکاری وایە, تۆ پارچەی بچووك لەیەك دەدەیت بۆ پێکهێنانی تەواوی پرۆژەکە و چوونکە هەمیشە کێشەکان لەناکاو دێنە پێش جا هەرکاتێك بێت.

### ئامۆژگاری چوارەم: پێویست نییە لۆگۆ دەربرینی پیشەی سەرەکی کۆمپانیاکە یان ئەو شتەی بۆی دروست دەکرێت بێت.

لۆگۆی Tiger Woods بریتی نییە لە یانەیەکی گۆڵف. لۆگۆی Virgin Atlantic بریتینییە لە فرۆکە و

هەروەها لۆگۆی Xerox بریتی نییە لە فۆتۆکۆپیکەر.

لۆگۆی کۆمپیوتەری پێویست نییە کۆمپیوتەر نیشان بدەن و لۆگۆی ددان سازەکان پێویست نییە ددان نیشان بدەن و کۆگای شتومەکی ناوماڵ و ڕایەخ پێویست نییە ڕایەخ نیشان بدەن.

تەنها لەبەرئەوەی ڕوونە, ئەوە مانای ئەوە نییە کە تۆ ناتوانیت دیزاینێکی باشتر بکەیت کە وێنای بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانی کڕیارەکەت بکات کە خاوەنیەتی.

### ئامۆژگاری پێنجەم: هەموو لۆگۆیەك پێوستی بە نیشانەیەك نییە.

هەندێك کات کڕیارەکەت تەنها پێوستی بە شێوەیەکی پرۆفیشناڵی لۆگۆ هەیە بۆ ناسینەوەی کارو پیشەکەی. بەکارهێنانی نیشانەیەك (Symbol)ـێك لەوانەیە زیادەیەکی بێ پێوست بێت.

ئەمە شتێکە کە تۆ دەتەوێت لەسەرەتای هەر پرۆژەیەك بیزانیت. داوا لە کڕیارەکەت بکە ئەگەر ئەو پەسەندیەکی هەبێت لە ڕێگەیەك یان یەکێکی تر. ئەگەر کۆمپانیاکە بەرەو بیرۆکەی فراوانکردنی کار

و پیشەیەتی لە بازاڕدا بۆ داهاتوو، ئەوە لەوانەیە باشتربێت کە یەکدانە لۆگۆی جیاواز هەڵبژێریت چونکە نیشانە و ئامرازێك لەوانەیە سنوردارکردنی بسەلمێنیت.

## ئامۆژگاری شەشەم: یەك شت کە پێوستە لەبیرتبێت.

هەموو لۆگۆ بەهێز و نایابەکان یەك تایبەتمەندیان هەیە کە یارمەتیدەرە لە خۆ جیاکردنەوەی لەگەڵ لۆگۆکانی دەوروبەر. لۆگۆی ئەپڵ تەنها قەپێکە. مێرسیدس تەنها ئەستێرەیەکی سێ نوکە. ڕێکخراوی خاچی سوور تەنها خاچە سورەکەیە.

ئەوەی پێوستە بۆ کڕیارەکەتی بەجێبهێڵیت تەنها یەك شت بێت سەبارەت بە ناسنامەی دیزاینە نوێکە کە تۆ دروستت کردووە

یەك شت بێت، دوو و سێ و چوار نا!

تەنها یەك!




## ئامۆژگاری حەوتەم: دەفتەری نیگارکێشانت لەبیرمەکە.

پێویست نییە تۆ نیگارکێش بیت بۆ هەستکردن بە سودەکانی نیگارکیشان لەماوەی پرۆسەی دیزاینکردنەکە. بیرۆکە خەیاڵییەکان زیاتر دەبن لەکاتێك تۆ کاخەز و پێنوس بەکاردەهێنیت بەبەراورد لەگەڵ بەکارهێنانی شاشە و ماوس. هەمیشە دەفتەرێکی نیگار یان تێبینی لەگەڵ خۆت هەڵبگرە.

## ئامۆژگاری هەشتەم: مۆدە  وازلێبێنە و بۆ بازاڕی فاشن و مۆدە بەجێی بهێڵە.

مۆدەکان دێن و دەڕۆن. کاتێك تۆ سەبارە بە گۆڕینی پانتۆڵێك یان کڕینی جل و بەرگێکی تازە دەدوێیت پاشان ڕۆیشتن لەگەڵ ئەم مۆدە لەوانەیە بۆت گونجاوبێت و کارت بۆ بکات. بەڵام ئەوەی

گرنگە بەلای ناسنامەی دیزاینە نوێکەی کڕیارەکەت ئەوا درێژای ژیانی ئەو ناسنامەیەیە کەواتە کلیلەکە بریتییە لە درێژی مانەوەی ناسنامەکە کە ئایا چەند تەمەنیەتی ئەم لۆگۆیە.




**ئامۆژگاری نۆیەم: دوورکەوە لە فۆتۆشۆپ**

بە تەن فێرکاری دروستکردنی لۆگۆ هەیە لەسەرهێڵ کە پێشانمان دەدات چۆن لۆگۆ دروست دەکەیت لە فۆتۆشۆپ. دوورکەوەرەوە لێیان. ئێمە لێرە باسی گرافیکی ڤێکتەر دەکەین، کەواتە ئەدۆبی ئیلسترەیتەر پێویستە هەڵبژاردەی تۆ بێت و فۆتۆشۆپ بۆ وێنە جێبهێڵە.

**ئامۆژگاری دەیەم: لەسەر ڕەش و سپی کاربکە.**




هیچ ڕێژەیەك ڕەنگ و تێکەڵی ڕەنگ و هەڵبژاردنی ڕەنگ دیزایینە هەژارەکەت ڕزگارناکات.

بە دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی ڕەنگ تا کۆتای پرۆسەکە، تۆ و کڕیارەکەشت دووردەبن لە هەر هەر کەمکردنەوەیەك لە نرخی لۆگۆکە و هەوڵبدە ڕەنگەکان بۆ کۆتایی پرۆسەکە بەکاربهێنت چونکە بەکارهێنانیان لەسەرتایی پرۆسەکە دەبنە هۆی شاردنەوەی عەیب و نەشیاوی لە لۆگۆکەدا کە ئەمەش کاردەکاتە سەر پیشەی دیزاینەر لە داهاتوودا.

**ئامۆژگاری یازدەیەم: با پەیوەست بێت بە بابەتەکەوە**

لێرەدا گیانێکی گشتی هەیە بۆ لۆگۆ جا ئایا تۆ دیزاین بۆ کۆمپانیایەکی یاسا دەکەیت یان نا؟ لێرەدا پێوستە ئەوەت لەیادبێت کە زۆر بواری ئارەزوو وخواست نییە...لەوانەیە کڕیارەکەت یان داواکارەکە

بەرنامەیکی منداڵان بەرهەمبهێنیت. لێرەدا شتەکان زۆر جدی و ڕشت نیین. لەوانەیە تۆ دیزانین بۆ ڕیستۆرانتێك بکەیت لەم حاڵەتەدا لەسەرتە کە ڕەنگی تاریك بەسەر ڕەنگی ڕووناك و گەش و درەوشاوە بەکاربهێنیت. بەردەوام دەبووم لە شیکردنەوە بەڵام پێموایە لە خاڵەکە تێگەیشتن.

## ئامۆژگاری دوازدەیەم: ئاسان خوێندنەوەت وتێگەیشتنت لەبیربێت.

خەڵکی چاویان بەو دیزاینانە دەکەوێت کە تۆ کردوتن بۆ چرکەیەك یان دوو چرکەیەك بێت پێش ئەوەی بەلایدا تێپەڕن. کەواتە کلیلکەکە بریتییە لە ئاسان خوێندنەوە و تێگەیشتن، بەتایبەتی کە بەرهەم و بابەتەکە زۆر بەناوبانگ نەبێت. بۆ نمونە، دەست و خەتی داواکار لەوانەیە زۆر جوان بێت، بەڵام ئەگەر زۆربەی خەڵکی پێیان نەخوێندرایەوە ئەوا تۆش وەکو لۆگۆ بەکاری مەهێنە.

## ئامۆژگاری سێزدەیەم: گرنگی دان بەهاوتایی (التنسيق)




جەخت لەسەر هاوتایی بکەرەوە و من لۆگاکانم بە ڕێبەرپییەوە بۆ کۆمپانیاکان دەنێرم و دروستکردنی ئەم ڕێبەریانەش ئەرکی تۆیە. ئەوان (ڕێبەرییەکان) دڵنیایی دەکەنەوە کە هەریەکێك لەناو سنوری کۆمپانیای کڕیار ئەوە دەکات کە لە ڕێبەریەکەیاندا هاتووە بە شێوەیەکی هاوتای و ڕێك و پێك. کەواتە هاوتایی و ڕێك و پێکی متمانە دروستدەکات و متمانەش کڕیار بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت.

## ئامۆژگاری چواردەیەم: گیانی کار و گونجاندنی لۆگۆ لەگەڵ نیشانەکە

یەکگرتووییەك بە درێژایی دیزاینەکەت نیشان بدە. بۆ نمونە، ئەگەر نیشانەیەکی خەندەئامێز پیشانبدەیت، هەوڵبدە لەگەڵ نوسراوێکی خەندە ئامێز بیگونجێنێت. بە واتایەکی تر، بۆ نمونە ئەگەر کۆمپانیای داواکار و کڕیاری لۆگۆ تایبەت بوو لە بواری یاری منداڵان، هەوڵ بدە گیانی گاڵتە و گەپ و پێکەنین لە دیزاینەکە ئامادەبێت و لەوانەشە ئەم گیانە بەهۆی ڕەنگێکەوە یان شێوەیەکەوە بێت کە تۆ و ئەوانیشی پێ سەرسام بووە.



## ئامۆژگاری پازدەیەم: تەنها نمونەی یەك ڕەنگییان پێشکەش بکە

بەپێشکەشکردنی لۆگۆکە بەتەنها یەك ڕەنگ ئەوا تۆ چاکسازی لەسەرتاپای پێناسەکە دەکەیت و کڕیارەکەت لە دووبارە گەڕانەوە بۆلای تۆ ڕزگاردەکەیت ئەگەر کۆمپانیاکە داوای هەڵبژاردنی یەك ڕەنگی لۆگۆکەی کرد بۆ چاپ و بابەتە پەیوەندیدارەکان. وە ئەمەش هۆیەکە بۆ دڵنیابوونەوەی کارەکەت لە هەڵە و کێشە و عەیب هەروەکو لە پیشتر باسمانکرد.

## ئامۆژگاری شازدەیەم: سەرەنجی جیاوازی بدە.

لێرەدا نوسەر مەبەستی ئەوەیە پێوستە ئەوە لەبەرچاوبگێرێت ئەگەر لۆگۆکە لەسەر بابەتی تر چاپکراوە وەکو بروشەر و نامیلەکە و ڕیکلامی بازرگانی و پۆستەر ئەوا لۆگۆکە بە ڕوونی دیاربێت لەنێوان پێکهاتە و بابەتەکانی سەر هەمان پاشبنەما. فراوانی ئاوازی ئەم لۆگۆیە پێوستە جیاوازی تەواوی هەبێت بۆ ئەوەی ڕێگە بە نیشانە و ئامرازەکە بدات بە ئاسانی و ڕوونی بناسرێتەوە.

## ئامۆژگاری حەڤدەیەم: سادەیی هاریکارە!

هێشتنەوەی دیزایینەکەت بە سادەیی وای لێدەکات ئاسانتر بناسرێتەوە لەلایەن خەڵك کاتێك بۆ جاری داهاتوو دەیبیننەوە. سەرەنجی کۆمپانیا گەورەکان بدە. بۆ نمونە، متسیوبوشی و سامسونگ و فێدێکس و هەوەها بی بی سی. لۆگۆکانیان سادەن لە ڕواڵەتدا و ئاسانن بۆ ناسینەوە لەبەر سادەییەکەیان. هێشتنەوەی بە سادەیی ڕێگە خۆشکەرە بۆ گونجاویی لە چەندان قەبارەدا. بەشێوەیەکی گشتی، لۆگۆکەت لە بچوکترین قەبارەی کاری خۆی دەکات بێ لەدەستدانی هیچ وردەکارییەکی و ناروونبوونی لەچاو ڕوونیەکانی تریدا.

## ئامۆژگاری هەژدەیەم: تاقیکردنەوە بەچەند قەبارەیەکی جیاواز

تاقیکردنەوە لەسەر چەند قەبارەیەکی جیاواز لەسەر کاخەز و گرنگی دان پێ و تاقیکردنەوەی چەند ڕەنگێك لەسەری بۆ دڵنیابوون لە ئامادەبوونی بۆ چاپ، چونکە لۆگۆی وەها هەیە لەکاتی چاپدا

ئەوەندە ناشیرین دەردەچێت لەبەرچاو دەکەوێت و کێشەی زۆری هەیە کە لەکاتی چاپەکە بەڕوونی دەردەکەون.

### ئامۆژگاری نۆزدەیەم: پێچەوانەکەیشی ڕاستە

ئەگەر تۆ لۆگۆکەت لەسەر پاشبنەما (Background)یکی سپی تاقیکردووەتەوە ئەوە باشە، لەوەش باشتر تاقیکردنەوە و ئامادەکردنیەتی لەسەر پاشبنەمایەکی ڕەش و ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێزکردنی توانای لۆگۆکە.




### ئامۆژگاری بیستەم: چی دەبێت ئەگەر ڕاست و چەپ و سەر و خوار بکرێت؟

دڵنیایی بکەوە لەخولاندنەوەی لۆگۆکە و سەیرکردنی لەچەند گۆشەیەکەوە، چونکە بینینی ئەم لۆگۆیە لەلایەن کەسێك و لە گۆشەیەکەوە پێوستە هەمان مانابدات کاتێك کەسێکی تر لە گۆشەیەك و ئاراستەیەکی ترەوە دەیبینێت و بەرچاوی دەکەوێت. ئەمەش چونکە لەوانەیە تۆ لەکاتی بینینی ئەم لۆگۆیە بەشێوەیەك بیبینیت لە گۆشەیەکەوە بێت لەوانەیە سەروژێربێت! کەواتە لەبەرچاوگرتنی ئەم خاڵەش زۆر گرنگە.

### ئامۆژگاری بیست و یەکەم: بیرتبێت کە لە ڕووی یاساییەوە تۆماری بکەیت.

ڕاستە کە کرداری تۆمارکردن و دانانی مافی پاراستن لەسەری کاتێکی دوور و درێژی پێوستە بەڵام ئەستەمیش نییە بەڵام ئەگەریش تۆمارکردنەکەت ئەنجامدا، ئایا تۆ ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی کاری یاساییت؟



### ئامۆژگاری بیست و دووەم: لێکدانەوە بۆ ئیحتیمالات و شیمانەکان بکە

لەوانەیە و لەوانەش نییە تۆ بەرپرسی هەڵەی چاپکردنی خەراپ بیت...! جا بۆیە ئەم خاڵە لەگەڵ کڕیارەکەت تاوتوێ بکە سەبارەت بە هەموو ئیحتیمالات و شیمانەکان کە لەوانەیە ڕووبدەن و تەنانەت چاپێکی بازرگانی هەرزانیش لەیاد مەکە... کەواتە باشترین لێکدانەوە و خوێندن بکە بۆ دەرخستنی لۆگۆکە بە باشرین شێواز.

### ئامۆژگاری بیس و سێ یەم: لە هەڵەکان مەترسێ!

هەمووان هەڵە دەکەن.... کەواتە مەترسێ و لە هەڵەکانت فێرببە و بۆ پێشەوە بڕۆ..




### ئامۆژگاری بیس و چوارەم: لۆگۆ شتێکە و پێناسیش شتێکی ترە

لێرەدا شتێك هەیە کە تۆ پێوستە باش بیزانیت: لۆگۆ بەشێکە لە پێناسی بازرگانی چونکە پێناس گەورەترە لە لۆگۆ بەهۆی لەخۆگرتنی مێژووی کۆمپانیا و گرنگی و تێروانینی خەڵك بۆ کۆمپانیا و کار

و پیشەیان. لۆگۆ بەشێکی گرنگە بەڵام نابێتە هۆی فرۆشتنی بەرهەمە هەرزانەکان و کۆمپانیاش لە قەیران و ڕووخان ناپارێزێت.

## ئامۆژگاری بیست و پێنجەم: بیرت بێت ئەمە پرۆسەیەکی دوو ئاراستەییە

لەوانەیە کڕیار داوای شتێکت لێبکات کە وات لێبکات ڕەقت لە کارەکت ببێتەوە. لەڕاستیدا ئەمە ڕوودەدات و ناخۆشیشە بەڵام وابکە خەڵکی کار و پیشەت بەرزبنرخێنن و هەوڵبدە لەگەڵ کڕیارەکەت بگەیتە ئەنجامێك کە لەگەڵ بیرۆکە و داوای کڕیارکە و ئارەزووەکانی تۆش وەکو لۆگۆ دیزاینەر بێتەوە.





سەرچاوەکان:

- پەرتووکی **Logo Design Love**ـی نوسەر و دیزاینەر دەیڤد ئەیرەی
- کۆمەڵێك پێگە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە خاڵەکان و پێداکردنی بەرگێکی کوردی بەبەریان.